## بەشێک لە دیوانی

# مەجزووب



دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی

زنجیرەی ڕۆشنبیری

*

**خاوەنی ئیمتیاز: شەوکەت شێخ یەزدین**

**سەرنووسەر: بەدران ئەحمەد حەبیب**

* * *

ناوونیشان: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، گەڕەکی ڕاپەڕین، هەولێر

ژمارەی تەلەفۆن: ٢٢٣٢٠٢١

سندووقی پۆستە ژمارە: ١

**بەشێک لە دیوانی**

# مەجزووب

## کاک ئەحمەدی پریسی "نەورۆڵی"

کۆکردنەوە و لێکدانەوەی

**حەکیم مەلا ساڵح**



ناوی کتێب: بەشێک لە دیوانی مەجزووب - کاک ئەحمەدی پریسی "نەورۆڵی"
کۆکردنەوە و لێکدانەوەی: حەکیم مەلا ساڵح
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٦٩
دەرهێنانی هونەری: بەدران ئەحمەد حەبیب
بەرگ: شکار عەفان نەقشبەندی
نووسینی سەر بەرگ: خۆشنووس محەممەد زادە
پیت لێدان: نسار عەبدوڵڵا
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمان مەحمود
چاپی یەکەم - چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر- ٢٠٠١
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٣٠٠)ی ساڵی ٢٠٠١ی دراوەتێ

# چرپەیەک

خوێنەری خۆشەویست: ئەم بەرهەمەی لەبەر دەستتدایە چەپکێکە لە شیعرەکانی ئەم شاعیرە کە بە پشوویەکی درێژەوە دوای گەڕان و سۆراخێکی زۆر هەر هێندەیمان دەست کەوت و بە خزمەتمان زانی کە بیبوژێنینەوە و بە چاپی بگەیەنین، بە نیازی ئەوەی کە هەم لە فەوتان رزگاریان بکەین و هەم بەڵکو ئەمە خوایە دڵسۆزانی شیعر و ئەدەبی کوردی شیعری تری شک بەرن و زیندووی بکەنەوە.

با ئەم هەوڵە سەرەتاییەی ئێمە دەستپێکێ بێت بۆ کەشف کردنی بەشی زۆرینەی ژیان و بەرهەمەکانی، چونکە دڵنیاین و هەروەکو بە شیعرەکانیشیدا دیارە گەلێ شیعری لەمە زیاتری هەیە، هەر بۆیە ئێمەیش ناومان نا بەشێک لە دیوانەکەی.

لە سەردەمی ژیانی ئەم شاعیرەماندا لە سنووری ناوچەی هەڵەبجە و دەوروبەریدا چەند شاعیرێکی ترمان هەبوون کە جگە لە (مەولەوی) ئەوانی دی هەموو دیوانیان نەماوە و دەبێ هەوڵی بووژاندنەوەیان بدرێت ئەگەر نەبووبنە خۆراکی بەڵای ڕۆژگار، ئەو شاعیرانەش وەکو (مەلا ڕەسوڵی فانی کە دەبێتە خاڵۆی مەولەوی، مەلا عەبدوللای داخی، عەبدوللا حەسەن، شێخ حەسەنی سازانی ناسراو بە بولبول، میرزا محەممەدی نەورۆڵی، عەبدوللا بەگی باپیرەی گۆرانی شاعیر، مەحرووم، ئینجە گەلاڵی، حاجی مەحموودی یارەویس، یوسف بەگی ئیمامی، کەیخوسرەو بەگی ئیمامی) لەناو ئەم شاعیرانەدا کە ناومان هێنان ئەوەی لەبەردەستی مندا شیعری لە هەموویان زیاتری هەبێت (یوسف بەگی ئیمامی)یە کە ئەگەر هەلم بۆ بڕەخسێ و دەستم بخونجێ لە دووتوێی کتێبێکدا هەوڵی ڕێکخستن و چاپکردنی دەدەم. کاک ئەحمەدی پریسیش ئەوەی وەک دیوان هەیبووبێ دیارە تیاچووە و ئەمەشی کە ئێستە لەبەر دەستدایە لە دوو سەرچاوە کۆکراونەتەوە



١- ئەو چەند لاپەڕەیەی کە زانای بەڕێز مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس لە بەرگی دووەمی یادی مەرداندا تەرخانی کردووە بۆ ئەم شاعیرە.

٢- ئەو بەیاز و دەستنووسانەی کە لای خۆمن یا دیتوومن.

ئیتر بە هیوای ئەوەی کە دڵسۆزانی ئەدەبی کوردی بێن بە دەنگمانەوە و هەرکەس شیعری لە لایە بیگەیەنێت بە دەستمان تا لە چاپی دووەمدا بیخەینە سەری و خەرمانی بەرهەمەکانی سوورتر و بە بەرەکەتتر بکەین

حەکیم مەلا ساڵح

٢٠٠١/٥/١ هەولێر

## کورتەیەک لە ژیاننامەی شاعیر

بە داخەوە تا ئێستە مێژووی ساڵی لە دایک بوون و کۆچی دوایی کردنی ئەم شاعیرەمان بۆ ڕوون نەبۆتەوە، بەڵام بەپێی شیعرەکانی و هەندێ ئاماژەی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس کە لە دیوانی مەولەوی و یادی مەرداندا کردوونی دەردەکەوێت کە شاعیر یەکێک بووە لە مەنسووبەکانی شێخ عوسمان سیراجەددینی نەقشبەندی و هاوچەرخی (مەولەوی و مەلا عەبدولڵای داخی...) بووە.

ناوی ئەحمەد کوڕی خەسرەوە، لەناو خەڵکدا هەم بە کاک ئەحمەدی پریسی ناسراوە و هەم بە کاک ئەحمەدی مەجذووب.

پریسیەکەی واتە خەڵکی گوندی پریسی سەرووی ناوچەی نەورۆڵییە کە دەکەوێتە خۆراوای شاری هەڵەبجەوە.

لەم بارەوە پێویستە ڕوونکردنەوەیەکمان هەبێت لەسەر ئەو ڕستەیەی کە مامۆستا مەلا عەبدولکەریم لە یادی مەرداندا ڕستی کردووە و دەڵێ: (لە خێڵی میکایەڵی جافە و لە دێی پریس لە ناو هۆزی نەورۆڵیدا دانیشتووە)[١].

ئەوی ڕاستی بێت کاک ئەحمەد لەسەری دایکەوە میکایەڵی بووە، ئەگینا لەسەری باوکەوە پشتاوپشتی هەر نەورۆڵی بووە، و ئێستەش نەوەی ماوە کە دەبنە حەمە سەعیدی نەسرین و کوڕانی خوالێخۆشبوو ئەوڕەحمانی نەسرین. پیاوانی ڕیش سپی نەورۆڵی بە تایبەتی پریسیەکان هەموویان ئەم ڕاستیەیان دەسەلماند، ئێستەش نەوەکانی خۆیان و هەموو کەسیش هەر بە نەورۆڵیان دەزانن و باسی میکایەڵی لە ناودا نییە.

بۆ ئەوەش کە پێیان گوتووە کاک ئەحمەدی مەجذووب، ئەوە بەو هۆیەوە بووە کە کەمەنکێشی شێخی سیراجەددین بووە و بۆتە مەنسووبی، ئەوەندە لە کۆڕی ذیکر و خواناسیدا جەذبە گرتوویە ناونراوە (مەجذووب) واتە

(١) بڕوانە یادی مەردان بەرگی دووەم. ل٤٨٨



ڕاکێشراو و کەمەنکێش کراو.

کاک ئەحمەد لە تەمەنی خۆیدا ئەوەندە پێداگر دەبێت لەسەر ڕێبازی سۆفیگەری و ئەوەندە باخچەی مەعنەوی خۆی دەڕازێنێتەوە بە پلەیەکی بەرز دەگات و مەولەوی لە بارەیەوە دەڵێ:

*بریا وە باڵای کاڵای ڕەئیسی*
*(رجال الغیب)ە ئەحمەد پریسی*

واتە بە پلەی پیاوانی غەیبزان دەگات.

دیارە مەولەوی ئەم قسەیەی لە خۆوە نەکردووە، بەڵکو ئەو ڕاستیەی لە کاک ئەحمەددا دیوە، بۆیە پێی لێناوە. کاک ئەحمەدیش لە پارچە شیعری (عەبام کیاستەن)دا کە پاشان پێیدەگەین هەمان پلە و پایەی بۆ مەولەوی داناوە،

کاک ئەحمەد هێندە دڵبەند دەبێ بە شێخی سیراجەددین و هێندە بە ڕێنما و کانگای عەشقی لاهوتی دەزانێت، جارێکیان کە شێخ لێی زویر دەبێت دەچێتە خزمەتی و ئەم بەیتە شیعرە فارسیەی بۆ دەخوێنێتەوە:

*رشتەء در گردنم انداخت دوست*
*می کشد هرجا کە خاطر خواه اوست*

واتە: دۆستەکەم ڕشتە و پەتێکی وای کردۆتە گەردنم، بەرەو هەر شوێنێ کە خۆی بیەوێ ڕایدەکێشێ.

ئەمە مانای ئەوە دەگەیەنێ کە بە دڵ و گیان تەسلیمی شێخ بووە و هەموو بڕیار و ئەنجامی کارێکی خۆی داوەتە دەستی ئەو. ئەم عیشقە پاک و بێگەردەی لەناو شیعرەکانیدا زۆر بە خەستی ڕەنگی داوەتەوە، بە تایبەتی لە پارچەکانی (ئارەزووی ویصال، بریان بەندی دڵ، وەمەی گێرتەنم)دا دیارە.

باوکی کاک ئەحمەد واتە (خەسرەو) لە سوپای عوسمانیدا چاووش بووە، کە چاووش وشەیەکی تورکیە بە واتای (نەقیب و پێشڕەوی لەشکر

یا لێپرسراوی سوپا ) دێت. نیظامی گەنجەوی دەڵێ:

ز دل دادن چـاوشــــــان دلـیــــــر
دلاور شــــده گــــور برجنگ شــــیــــر

واتە: بە کوشتنی چاوشە دلێرەکـان، کەری وەحشی لە شەڕی بەرامبەر شێردا بوو بە دلاوەر.

(خەسرەو و چاووش) پیاوێکی بە ناو بووە و لەگەڵ عەلی چاووشی برایدا لای کەیخەسرەو بەگی جاف باوکی محەمەد پاشای جاف ڕێزی تایبەتییان هەبووە و لەناو عەشیرەتی نەورۆڵیشدا دەم سپی و جێگای متمانە بوون. هەروەها پیاوێکی ئازا و بە جەرگ و سوارچاکێکی کارامە بووە.

ئەگێڕنەوە کاتێ کە سوپای عەجەم لە دەشتی مەریواندا مۆڵ دەبەستێ بە مەبەستی ئەوەی هێرش بکاتە سەر دەسەڵاتی بابانیەکان لە (قەڵاچوالان). میری بابان داوای ئەم و ئەکرەم بەگی ئەوغانی کە لە گوندی (چرۆسانە)ی نەورۆڵیدا بووە دەکات بۆ چوونە شەڕی ئەو لەشکرەی عەجەم، ئەمانیش بەدەم بانگەوازەکەوە دەچن، بەڵام کاتێ کە لە شارەزووردا دائەنیشن بۆ ئەوەی وچانێک بدەن، خەسرەو چاووش مار پێوەی دەدات و پەکی دەکەوێت، لەبەر ئەوە بە ناچاری دەگەڕێتەوە، ئەکرەم بەگ دەڕوات و مەسەلەکەی خەسرەو چاووش بۆ میر باس دەکات، ئەویش یەکێکی تر لە جێگەیدا دادەنێ و دوانزە سوارەی مەریوان پێکدێنن. کە ڕووداوی دوانزە سوارەی مەریوان لە مێژووی گەلەکەماندا جێگای دیارە و تا ئەم دواییانەش لە هەڵەبجە و هەندێ ناوچەی تردا یاد دەکرایەوە.

## پلەی خوێندن

شاعیر سەرەتا لە زێدی خۆیدا دەست دەکات بە خوێندنی سەرەتایی و پاشان بە شێوەی فەقێیەتی لە (هەڵەبجە و نۆدشە و مزگەوتی دار الاحسانی سنە) چەند قۆناخێکی تری خوێندن دەبڕێت. بەڵام دوای مردنی



باوکی و عەلی چاووشی مامەی بە ناچاری دەست بەرداری خوێندن دەبێت و ئەرکی بەڕێوەبردنی ژیانی ماڵەوەی دەکەوێتە سەر شان، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەرکی ماڵ و موڵکداریەکەی گران ئەبێت، بەڵام لە کۆڕی خوێندەواران تەریک ناکەوێت، بەڵکو هەمیشە هاودەمی و هاوشانی کردوون و هەندێک لەم دیاردەیە لە شیعرەکانیدا دیارە، وەکو ئەو پارچە شیعرانەی کە بۆ (میرزا محەمەد و شێخی سیراجەددین و مەولەوی و مەلا عەبدوڵڵای داخی و مەحموود پاشای جاف)ی نووسیون. شایانی باسە بەو وشە و تەرکیبات و زاراوانەی کە لە شیعرەکانیدا بە کاری هێناون پلەی خوێندەواری و ڕادەی ڕۆشنبیریی شاعیر دەردەکەون و ئەگەر شارەزایەکی باشی ئەو بوارە نەبوایە ئەوا هەرگیز نەیدەتوانی ئەو تەرزە شیعرە هونەرییە بڵێت کە ئەگەر بەراوردی بکەیت لەگەڵ شاعیرە نەخوێندەوار یا کەم خوێندەوارەکانی دەورانی پێشوودا ئەوا ئاسمان تا ڕێسمانیان فەرقە و باڵای شیعرەکانی ئەم لەچاو ئەواندا گەلێ بەرز هەڵچوون و تام و چێژی هونەرییان هەیە. تەنانەت دەتوانین بڵێین لە هەندێ کۆپلێت و وێنەدا بە ئاسانی لە شاعیرێکی پایەبەرزی وەکو مەولەوی نزیک کردۆتەوە.

عەشیرەتی نەورۆڵی لە ناو هۆز و تیرەکانی جافدا یەکەمین عەشیرەت بووە کە زیاتر لە ٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر وازیان لە کۆچ و ڕەو هێناوە و نیشتەجێ بوون، لەگەڵ جێوار بوونیاندا لە گوندەکانی (پریسی سەروو، چرۆسانە، گونە، سەراو، هانە سوورە)دا مزگەوتیان بنیات ناوە و بەمەش شۆڵەی چراوگی خوێندن دەڤەرەکەی کرۆتە تیشکستان، هەر ئەمیچە بۆتە هۆی ئەوەی کە کەسێکی وەک کاک ئەحمەد لە زێد و هەرێمی خۆیدا بە ئاسانی دەستی بە خوێندن بگات و هەروەها خەڵکی نەورۆڵی ڕوو لە خوێندن بن و ڕێزی زانا و خوێندەواران بگرن. پاش ئەو گوندانەی کە ناومان بردن هەموو گوندەکانی تری نەورۆڵی یەک لە دوای یەک مزگەوتیان تێدا کراوەتەوە و بوونەتە لانکی خوێندن و خواپەرستی و خەڵک لە ناوچەکانی ترەوە بە مەبەستی فێر بوون ڕوویان تێ کردووە.

## کاک ئەحمەد بۆ دیوانی کۆکراوەی نەبووە؟

لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەتوانین بڵێین شاعیری کۆنمان نییە کە سەرجەمی شیعرەکانیان دیار بن، دیوانی ئەو شاعیرانەش کە بە زۆرترین شیعر چاپکراون وەکو (مەلای جزیری، خانی، نالی، مەحوی، شێخ ڕەزا، کوردی، سالم، وەفایی، وەلی دێوانە، ڕەنجووری و چەندین شاعیری دی) و تەنانەت تا دەگاتە ئەم دەورانەی دواییەش شاعیرانی وەکو (گۆران، قانع، حیلمی و...هتد) هێشتا بە تەواوی شیعرەکانیان گرد و کۆ نەکراونەتەوە و شیعریان هەیە کە بە دەردو بەڵای کوردەواری تێداچوون، یاخود لە کەشکۆڵ و بەیاز و دەستنووسەکاندا ماونەتەوە، لەم ڕووەوە ئەگەر سەرنجی هەوڵ و تێکۆشانەکانی (مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و کاکە حەمەی کوڕی و کاک محەممەد عەلی قەرەداغی) و هەندێ کاری تر بدەین ئەو ڕاستیەمان لە لا دەسەلمێ.

سەبارەت بەو شاعیرانەی دەورەی مەولەوی لە دەڤەری هەڵەبجەدا کە ناومان بردن و یەکێکیان ئەم شاعیرەیە واتە کاک ئەحمەدی پریسی، هۆی تیاچوونی زۆربەی شیعرەکانیان دەگەڕێتەوە بۆ ڕووداوێکی مێژوویی - سیاسی کە مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس لە بەرگی دووەمی (یادی مەردان ل ٣٨٤)دا کورتە باسێکی لێوە کردووە.

کە دەفەرمووێ: (لەو سەردەمەدا دەوڵەتی عوسمانی ئەیەوێ چەک لە محەممەد پاشا و خێڵەکەی وەربگرێ و بێ چەکیان بکا، بەم نیازە عومەر پاشای سەردار بە سوپاوە ئەنێرێتە سەریان. ئەوانیش ناچار ئەبن شارەزوور بەجێ دێڵن و ئەگوێزنەوە بۆ ئەو چیایانەی بنار.)

تا دەڵێ (عومەر پاشایش گەلێ لە دێهاتی شارەزوور ئەسووتێنێ کە هی دەستە و دائیرەی محەممەد پاشا ئەبن.)

هەروەها دەڵێ (ئەم کارەساتە لە ١٢٧٦ی هیجرەتدا ڕووی داوە).

بۆ زیاتر تیشک خستنە سەر ئەم ڕاستیە دەبێ بڵێین:

١- دیوانی شیعر و کتێبخانەکەی مەولەویش هەر لەم کارەساتەدا



سووتاون، چونکە هەروەکو مامۆستایش لە نووسینەکەیدا ئاماژەی پێکردووە، ئەو دەمە (مەولەویش ماڵی لە چرۆستانە ئەبێ بار ئەکا ئەچێ بۆ پشتی کانیکەوەی شەمێران). کەواتە ئەم ڕووداوەیە نەک ئەوەی کە کاک محەممەدی مەلا کەریم دەڵێ (کارەساتێکی ناخۆشتریش لە ژیانی مەولەویدا سووتانی کتێبخانەکەیەتی کە لە ئەنجامی شەڕێکی نێوان خێڵی ئیمامی و تاوگۆزیدا پڕیشکی ئاگری شەڕ کەپرەکەی مەولەوییشی گرتووەتەوە و ئاگر بەربووەتە کتێبخانەکەی)... میهرەجانی مەولەوی-٢٠٠٠ ل٦٢ ئەمەی کاکە حەمە دەیلێ شەڕێکی ترە و لە وتارێکدا ڕاستم کردۆتەوە.

بەڵام بۆچی شیعری مەولەوی لە شاعیرانی تری ئەو دەورانە زیاتر ماون؟ ئەوە هۆی سەرەکیی دەگەڕێتەوە بۆ:

١- شیعرەکانی مەولەوی باڵادەستتر و شێواترن.

٢- زۆربەی هەرە زۆریان لە کوردستانی بەشی ئێران پارێزراون کە بەفەقێیەتی تەمەنێکی لە (پاوە، جوانڕۆ، سنە، بانە، مەهاباد، مەریوان) بەسەر بردووە. بۆ شایەتی ئەمەش بەندە ئێستە نۆ بەیازم لەلایە کە پڕن لە شیعری مەولەوی و لە شاری (سنە، جوانڕۆ) و ناوچەکانی (سارالّ، هۆبەتوو، هەورامان) دەستم کەوتوون.

٣- مەولەوی بە هۆی ئەو پلە و پایە دینیەوە کە هەیبووە شیعرەکانی بە تەبەڕووک سەیرکراون و خەڵک بۆ موبارەکی لای خۆیان نووسیونیانەتەوە.

بەڵام لە ڕاستیدا شیعری شاعیرەکانی تر بەم شێوە نەبوون بۆیە ڕۆژگار کردوونی بەژێر بەڵای خۆیەوە.

هەموو دەزانین و مێژوو پێمان دەڵێ کە محەممەد پاشای جاف پەیوەندی گەرم و بە تینی لەگەڵ ڕۆشنبیرانی سەردەمەکەیدا هەبووە، بە تایبەتی شاعیرانی دەڤەری هەڵەبجە، بۆیە لەو کارەساتەدا باسمان کرد ڕۆشنبیرانیش زیانیان تێدا کردووە، جگە لە ڕاونان زیانی گەورەیان ئەوە

بووە کە شیعرەکانیان لەگەڵ سووتانی گوند و ماڵەکانیاندا تیاچوون. کاک ئەحمەدیش یەکێک بووە لە دۆستە هەرە نزیکەکانی محەممەد پاشا و لەو ڕووداوەدا زەبری کارێگەری بەرکەوتووە.

***

*ئارەزووی ویصال دەروونم دا جۆش
هۆرکەند جە بێخدا ئەو بونیادی هۆش[(١)]
ڕاگەم گرت نەوەر (تەوێڵە) مەنزڵ
پەرێ شەفای زام چەم و دەم و دڵ[(٢)]
مەشوون وە خزمەت پیری مەیخانە
تا تێر بنۆشوون مەی وە پەیمانە[(٣)]
مەی نیشاطی ڕۆح، قووەی ضەمیرەن
پەرێ زەنگاری هەستیم ئیکسیرەن[(٤)]

* ئەم شیعرە بۆ شێخی سیراجەددین نووسراوە بە مەبەستی ئەوەی بچێتە لای و تەمەسسوک بکات.
(١) ویصال: بە یەک گەیشتن. داجۆش: هێنایە کوڵ. هۆرکەند: هەڵکەند. بونیاد: پایە و بنیات.
واتە: مەیل و ئارەزووی بە یەک گەیشتن دەروونی هێنامە کوڵ و پایە و بنیاتی هۆشی لە بێخ و بنچینەدا هەڵکەندم.
(٢) ڕاگەم گرت نەوەر: ڕێگام گرتەبەر. تەوێڵە: گوندێکە لە هەورامانی لهۆن لای خۆرهەڵاتی هەڵەبجە و زێدی شێخی سیراجەددین و کوڕەکانیەتی. پەرێ: بۆ. چەم: چاو.
واتە: ڕێگام گرتەبەر بەرەو مەنزڵ کە تەوێڵەیە، ئەویش بۆ سارێژ بوونی زامی چاو و دەم و دڵ.
(٣) مەشوون: دەڕۆم. پیری مەیخانە: مەبەست شێخی سیراجەددینە کە سەردەستەی شێخە نەقشبەندییەکانی هەورامانە. بنۆشوون: بنۆشم. مەی: مەبەست باوەڕ و ئیمانە، ئەم وشەیە بەم واتایە لای شاعیرە عاریفەکان لە کۆنەوە بەکار هاتووە.
واتە: دەڕۆم بۆ خزمەتی شێخی سیراجەددین بۆ ئەوەی ئیمان و باوەڕی بە شێوەیەکی تەواو لە دەست وەربگرم.
(٤) نیشاط: شادی و خۆشی. قووەی ضەمیرەن: هێزی ویژدانە. زەنگار: ژەنگ. ئیکسیر: مادەیەکە کیمیاگەرە کۆنەکان بەکاریان هێناوە بۆ گۆڕینی جیوە بە زیو، مس بە ئاڵتوون و...هتد.
واتە: باوەڕ مایەی شادی ڕۆحە و هێز دەدات بە ویژدان و بۆ ئەو ژەنگەی کە هەستیی گرتووم ئیکسیرە.



هەی هەی نەو مەیە پیرم ساقیش بۆ
وەگیان هەرزانەن، سەرم باقیش بۆ[(٥)]
ساقی گیان پێم دەر یەک جامی لەبرێز
مەست بوون نەی دنیا تا ڕۆی ڕەستاخێز[(٦)]
ئەر وەو حاڵەوە نەشوون وە مەحشەر
یاگەم دۆزەخەن هەی خاکم وەسەر[(٧)]

تێبینی: لەم پارچە شیعرەدا پێچەوانەی ئەو گێڕانەوەیەمان بۆ دەردەکەوێ کە مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس لە ل ٤٨٩ی بەرگی دووەمی (یادی مەردان)دا ڕستی کردووە و دەڵێ (لە شێخ عەلائوددینم بیست گێڕایەوە وتی: ئەحمەد پریسی لە تەمەنی چواردەساڵیدا لەگەڵ عەبدوڵڵای مراد وەیس بە فەقێیی ئەچن بۆ دێی نۆدشە، لە ڕێگەدا لە تەوێڵە لائەدەن، لەوێ شەو ئەچنە ناو حەڵقەی خەتمی موریدەکانی شێخ سیراجەددینەوە. ئەوانیش بە بیانووی ئەوە کە منالن و داخڵی تەریقەت نەبوون ئەیانکەنە دەرەوە. ئەمانیش غیرەتیان قوبووڵ ناکا، هەر بەو شەوە خەلیفەیەک ئەدۆزنەوە و تەریقەتی لەسەر دەستا وەرئەگرن و ئادابی تەریقەتی لا فێر ئەبن و ئەچنەوە ناو حەڵقەی خەتم.)

چونکە شیعرەکە بە ناوەڕۆکیدا دیارە کە شاعیر بە قەناعەت گەیشتووە و

(٥) نەو: لەو. بۆ: بێ.
واتە: هەی هەی لەو باوەڕە کە شێخی سیراجەددین بیباتە دڵی خەڵکەوە، بە ڕاستی بە گیان بیکڕی هەرزانە و با سەریشم باقی بێت.
(٦) لەبرێز: وشەیەکی فارسیە بە واتای پڕ و لێوان لێو. بوون: ببم. نەی: لەم. ڕۆی: ڕۆژی. ڕەستاخێز: وشەیەکی فارسیە بە واتای ڕۆژی دوایی (قیامەت).
واتە: یا شێخ باوەڕێکم فێر بکە کە تەواو و بێ کەم و کەسر بێت و لەم دونیا بمخاتە حاڵی جەزبەوە تا ڕۆژی قیامەت.
(٧) نەشوون: نەڕۆم. یاگەم: شوێنم.
واتە: ئەگەر بەو حاڵەوە نەڕۆمە مەیدانی حەشر، ئەوا لەو دونیا شوێنم دۆزەخ دەبێت...

ڕێگای تەوێڵەی گرتۆتەبەر بۆ ئەوەی لەسەر دەستی شێخدا داخڵی تەریقەت ببێ. یا بڵێی شاعیر ئەم شیعرەی لە تەمەنی چوارده ساڵیدا وتبێ و شێخ کردبێتیە موریدی خۆی؟

یا بڵێی بەر لە سەفەرەکەی بۆ نۆدشە بە مەبەستی خوێندن ئەم شیعرەشی ناردبێ بۆ شێخ بۆ ئەوەی لەگەڵ چوون بۆ نۆدشەدا لە ڕێگە لە تەوێڵە لابدات و ئادابی تەریقەت وەربگرێ؟

ئاخ فەڵەک کارت یەند کاریی و سەختەن
هەرچی موازوون خیلافی بەختەن[1]
نە شنۆت بێگەرد، نە گوڵت بێخار
هەر گا وە تەرزێ دڵ مەدەی ئازار[2]
کالای بازاڕی شادیم وەتاراج
مەبەری و، مەدەی سککەی ناڕەواج[3]
چ خێرەن پەی پەی خەدەنگ مەکیانی؟
مەشێونی یانەی یارانی جانی[4]

(١) یەند: هیندە. کاریی: کاریگەر. موازوون: ئەخوازم.

واتە: ئاخ فەلەک کردەوەت هیندە کاریگەر و سەختە، هەرچی من دەیخوازم بە پێچەوانەی بەختەوە بۆم دێت.

(٢) شنۆ: شنە. خار: دڕک. هەر گا وە تەرزێ: هەرجارەی بە جۆرێ. مەدەی: ئەدەی.

واتە: ئەی فەلەک نە شنەبات بێگەرد و تۆزە و نە گوڵیشت بێ دڕکە، هەر جارەی بە جۆرێ دڵ ئازار دەدەیت.

(٣) مەبەری: دەبەیت. سککەی ناڕەواج: پارەی قەڵب کە نەڕوات و هیچی پێ نەکڕێ.

واتە: کەلوپەلی بازاڕی خۆشی و شادیم بە تالان دەبەیت و لە جیاتیدا پارەی قەڵبیشم دەدەیتێ.

(٤) پەی پەی: لە پەسا، یەک لە دوای یەک. خەدەنگ: تیر. مەکیانی: دەنێری. مەشێونی: ئەشێوێنی. جانی: گیانی بەگیانی.

واتە: چ خێرێکە وا لە پەساتیرمان بۆ دەنێری و ماڵ و حاڵی دۆستانی گیانی بە گیانی دەشێوێنی.



چەند ڕۆێ هامڕاز عوشاقی دڵ بیم
چون بولبول سەرمەست سەودایی گوڵ بیم[5]
یاران جەم، دڵ وەش، حوزن نەوەردە
سیرِ پەنهان نەبی قەت نەتۆی پەردە[6]
جەرگەمان پڕ شەوق، شادیی، صەداقەت
مەستبین وە جورعەی بادەی حەقیقەت[7]
وەفا فراوان، صەفا بێ پایان
خەفا نومایان، جەفا کۆتایان[8]
وە دڵنەوایی مەکەردیم بازی
موستەعید ڕەواس، سوختە وە قازی[9]

(٥) ڕۆێ: ڕۆژێ. بیم: بووم.

واتە: چەند ڕۆژێ هاودەم و هاوڕازی خۆشەویستانی دڵ بووم و هەر وەکو بولبول سەرمەستی عەشقی گوڵ بووم.

(٦) وەش: خۆش. نەوەردە: نەخواردوو. سیرِ: نهێنی.

واتە: یاران کۆ بووین، دڵمان خۆش بوو، خەفەتمان نەدەخوارد، هەرگیز لە نێوانماندا نهێنیش لەو دیوی پەردەوە شاراوە نەبوو.

(٧) جەرگە: کۆڕ. صەداقەت: ڕاستگۆیی. جورعە: پێک. بادە: شەراب.

واتە: کۆڕمان پڕ لە شەوق و خۆشی و شادی و ڕاستگۆیی بوو. هەموومان بە پێکی شەرابی خواناسی مەست بووین.

(٨) خەفا: شاراوە. نومایان: ئەنوێنرا.

واتە: لەو کۆڕەماندا وەفا زۆر هەبوو، پاکی بە شێوەیەکی فراوان هەبوو، شتی شاراوە دەرئەخرا و جەور و جەفا هەر نەبوو.

(٩) مەکەردیم: ئەمان کرد. موستەعید: فەقێیەکە لە دوا پلەکانی خوێندند. ڕەواس: ڕێوی. سوختە: فەقێیەکە لە سەرەتای خوێندندا.

واتە: بە دڵخۆشی و بە دڵدانەوەی یەکتر گەمەمان دەکرد (زۆر ئاسایی بوو) موستەعید دەبووە ڕێوی و سوختە دەبووە قازی.

سێ باز و کەوشەک، کێل و بەرد، جوغزێن
گەنم گرتی جۆ، کلاو کلاوێن[10]
دەقنەو و ڕاتبەی فەقێ گەرم بی
چیوێ وجودش نەبی شەرم بی[11]
گا گا جەم مەبێن نەدەوری مەلا
وە ئەندەرز جامی دڵ مەدا جەلا[12]
ئیسە ئەوان شاد، من مات و مەحزوون
جەی عوزلەت حەیات چۆن بەسەر بەروون؟[13]

***

استغفرالله... استغفرالله
جە کردەی بەدم، استغفرالله
کەردەم ناکەردە، عصیانم بێ شۆن
تەنها ئومێدم وەڕەحمەتی تۆن[1]

(١٠) هەموو وشەکانی ئەم بەیتە پێنج یاری فۆلکلۆرین.

(١١) دەقنە: ئەوە بوو کە شەو فەقێیان بە دەستەجەم دەگەڕان و دەیاندا لە دەرگای ماڵان و داوای شەکر، چا، برنج، ساوەر و شتی دیان دەکرد بۆ بژێوی خۆیان. ڕاتبە: ئەوە بوو فەقێیەک بە تەیکەیەکەوە دەگەڕا و نانی کۆ دەکردەوە. چیوێ: شتێ.
واتە: دەقنە و ڕاتبەکردنی فەقێ گەرم بوو، شتێک کە وجوودی نەبوو لەلامان شەرم کردن بوو، مەبەستی ئەوەیە بێ شەرم کردن لە دەرگای هەموو ماڵێکیان داوە.

(١٢) مەبێن: دەبووین. ئەندەرز: پەند و سەرزەنشت. مەدا جەلا: پاکی دەکردەوە.
واتە: جارجاریش لە دەوری مەلا کۆ دەبووینەوە، ئەویش بە پەند و سەرزەنشت کردنمان ئاوێنەی دڵی لە ژەنگ پاک دەکردینەوە.

(١٣) عوزلەت: گۆشەنشینی. بەروون: ببەم.
واتە: ئیستە هاوڕێکانم شادن و منیش مات و غەمگین. چۆن لەم گۆشەنشینیەدا ژیان بەسەر بەرم.

***

(١) عصیان: تاوان و گومڕایی. شۆن: ئەندازە. تۆن: تۆیە.



بی گشت گوناوە، بی چەمی بێ سوو
غافڵ نمەبوون جە (لاتیأسوا)[2]
من (لاتقنطوا) ویردی زەبانمە
قووەیی بێحەد ڕووح و جانمە[3]
رۆژگاری ئەسیر دامی بەڵا بیم
وە بادەی عیشقی چەم مویتەلا بیم[4]
ڕەفتم وەڕاگەی دنیا پەرەستان
مەست بیم وە دوردی صەهبایی پەستان[5]
نۆشانۆش بادەی هەوای نەفسم وەرد
سەجدەم وە میحراو ئەبرۆی صەنەم بەرد[6]
ڕاگەی مەجازیم بێ ترس کەردەن تەی
وە سەدای موطریب وە قوڵقوڵەی مەی[7]
بۆی لیمۆی نەوڕەس نەباخان کەردم
نەزانام چۆن بی ژیام نەمەردم[8]

(٢) بی: بەم. گونا: گوناح و تاوان، چەمی بێ سوو: چاوی بێ تروسکایی. غافڵ نمەبوون: بێ ئاگا نابم. جە: لە. لاتیأسوا: ئاماژەیە بۆ ئایەتێکی قورئان، واتە نائومێد مەبن.

(٣) لاتقنطوا: هەر ئاماژەیە بۆ ئایەتێکی قورئان بە هەمان واتا. قووەیی بێحەد: هێزی لە ڕادە بەدەر. جان: گیان.

(٤) ئەسیر: دیل و بەند. دام: داو. بیم: بووم. بادە: شەراب. چەم: چاو. مویتەلا: گیرۆدە.
مەبەست لە (عیشقی چەم) عەشقی مەجازی و دنیاییە کە دەکاتە پێچەوانەی عەشقی حەقیقی واتە عەشقی خودایی کە لەدڵەوە سەرچاوە دەگرێ.

(٥) ڕەفتم: ڕۆشتم. وەڕاگەی: بەڕێگەی. دورد: خڵتەی شەراب. صەهبا: شەراب. پەستان: کۆی پەستە بە واتای کەسانی نزم و دەنی تەبع.

(٦) بادە: شەراب. هەوا: ئارەزوو. وەرد: خواردەوە. صەنەم: بت، مەبەست ئافرەتە. بەرد: برد.

(٧) کەردەن تەی: پێوام – ڕێگای عیشقی مەجازیم بێ ترس پێوا. سەدا: دەنگ. موطریب: گۆرانیبێژ.

(٨) نەوڕەس: تازەگەییو. کەردم: کردم. نەزانام: نەمزانی.

ئیسه هازامی پیریی مدۆ چڵ
مشیۆ پەنابەر وەپیری کامڵ[9]
هەرتا جەدەواخانەی لوطفی وێش
زامی دەروونم بکەرۆ سارێش[10]
وەرنە بی تەرزە بشوون وە مەحشەر
مەعلوومەن مەجذووب یاگەمەن سەقەر[11]

(ئەم شیعرەش دیسان پێچەوانەی ئەو گێڕانەوەیەی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمە کە لە پەراوێزی پارچە شیعری یەکەمدا نووسیومانە، چونکە لە بەیتی پێنجەوە تا بەیتی نۆیەم باسی دەورەی گەنجێتی دەکات کە بە ئارەزوو ڕایبواردووە و لە بەیتی دەیەمدا کە دەڵێ:

ئیسه هازامی پیری مدۆچڵ
مشیۆ پەنابەر وەپیری کامڵ

وای دەردەخات کە لە سەرەتای پیریدا هاتۆتە سەر ئەوەی کە لای مورشیدێک ڕێگای پێچەوانەی پێشووی بگرێ)

***

(٩) مدۆچڵ: ئێش دەکات. مشیۆ: دەبێ. پیری کامڵ: دیارە مەبەست شێخی سیراجەددینە.
(١٠) هەرتا: تاکو. دەواخانە: شوێنی داودەرمان. وێش: خۆی. بکەرۆ: بکات
(١١) وەرنە: ئەگینا. بی تەزرە: بەم شێوە. بشوون: بڕۆم. یاگەمەن: جێگامە. سەقەر: جەهەنم.



* ئەر پەرسی: چەنیم چەنی پەژاران
ئەڵبەت مالوومەن جەلای نازاران[1]
تا جەلای جەبهەی لەیلێ هەر شێوەن
قەیس هەر ڕۆ تەرزێ دێوانە و لێوەن[2]
تا نیم نیگای عەین دیدەی حەویوەن
من مەرگم میوان، دەردم نصیوەن[3]

***

ئاینەی ڕووخسار لەیل لێوەم کەردەن
ئەراگێڵەنان، شادم وە مەردەن[1]
دڵی وێم بە کۆی بێستوون زانا
ئەو وەیەک جەلا پاماڵش کەردەن[2]

* ئەم شیعرە مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسیش لە بەرگی دووەمی یادی مەرداندا بڵاوی کردۆتەوە ل٤٩٦. بەپێی ناوی حەبیب لە شیعرەکەدا و هەروەها لە پارچە شیعری (هەر ئاخ داخمەن) کە پاشان پێی دەگەین لەوە دەچێ بۆ حەبیب ناوێ نووسرابێ، جا دوور نییە ئەو حەبیبە حەبیبوڵڵا خانی باوەجانی بێت کە دۆستی مەولەویش بووە.
(١) چەنیم: چۆنم. چەنی: لەگەڵ. جەلای: لەلای.
واتە: ئەگەر لێم دەپرسی چۆنم لەگەڵ خەم و پەژارەدا، ئەوە شتێکە ئەڵبەتە لای نازداران دیارە و مەعلوومە.
(٢) جەلا: ڕۆشنیی. جەبهە: تەوێڵ. تەرزێ: شێوەیەک.
واتە: تاکو ڕۆشنیی تەوێڵی لەیلا هەر شێوەیەک بنوێنێ، ئەوا قەیس (مەجنوون) هەر ڕۆژێ بە شێوەیەک شێت و شەیدایە.
(٣) عەین: چاو. حەویوەن: حەبیبەن: خۆشەویستە.
واتە: تا نیونیگای چاو تەماشای حەبیب بکات، من مەرگ میوانمە و دەرد و ئازار چارەمە.

***

(١) لێوە: شێت و شەیدا. ئەراگێڵ: ئاوارە.
واتە: ئاوێنەی سیمای لەیل شێت و شەیدای کردم، ئێستە ئاوارەم و شادم بەوەی کە بمرم.
(٢) وێم: خۆم. زانا: زانی. جەلا: ڕۆشنی (وشەیەکی عاریفانەیە). پاماڵ: بە یەکجاری لەناوبردن.
واتە: دڵی خۆم بە چیای بێستوون زانی، کەچی ئەو بە یەک تیشک یەختەساری کرد.

لەم چوارینەیەدا وشەی (لەیل) بە کینایە مەبەستی شێخەکەیەتی کە دیارە شێخی سیراجەددینە. وشەی (جەلا)ش وشەیەکی عاریفانەیە. لای کاکەییەکان واتای (درەوشانەوەی نوور و ڕۆشنایی خودایە لە بەدەنی عاریفی کامیلدا). لای عاریفە موسڵمانەکانیش بریتییە لە (دەرکەوتنی خوای گەورە خۆی لەخۆیدا).

*ئەوسەتا چەپگەرد ڕاست مگەرد کەم کەم
ڕان وەبان ڕان منیشتین وەهەم
ئیسە هەر وەختێ تاسەی تۆمانەن
وەسەودای نامە ئامو شۆمانەن(۱)

* * *

**ئەلعەجەب، دیدەم، عەجیبتەر چێشەن
چەند ساڵەن وە تیر عیشقت دڵ ڕێشەن(۱)
قرچە و چۆقەی جەرگ سەنگ نەبەڕ تاوان
هێمای پزیسکەش وەتۆ نەیاوان(۲)

* * *

* ئەم چوارینەش مامۆستا مەلا عەبدولکەریم لە ل٤٩٠ی بەرگی ۲ی یادی مەرداندا بڵاوی کردۆتەوە.
(۱) مگەرد: ئەگەڕا. منیشتین وەهەم: پێکەوە دادەنیشتین.
واتە: ئەوساتە چەرخی چەپگەرد بە ڕاستدا لەسەرخۆ دەگەڕا، ڕانمان دەخستە سەر ڕانی یەکتر و پێکەوە دادەنیشتین، کەچی ئێستە هەر کاتێ تاسە و ئارەزووی تۆ دەکەم، دەبێ نامە بۆ یەکدی بنێرین و (ناتوانین وەک جاران لێکەوە نزیک بین).

* * *

** ئەم چوارینەش لەهەمان سەرچاوەی پێشوودا بڵاوکراوەتەوە. لە بەیازێکی لای ئێمەدا لەباتی (عەجیبتەر چێشەن) نووسراوە (عەجەب جەچێشەن) بەڵام ئەوەی لای مامۆستا ڕاستترە.
(۱) ئەلعەجەب: سەیرە. چێشەن: چیە. ڕێشەن: بریندارە.
واتە: زۆر سەیرە چاوەکەم، چی لەوە سەیرترە کە چەند ساڵێکە دڵم بە تیری عەشقت بریندارە.
(۲) نەبەڕ: لە وشکاییدا. تاوان: تواندەوە. هێمای: هێشتا. نەیاوان: نەگەیشتووە. =



باڵاّ وێنای سەوڵ، چەم نێرگس، خەدگوڵ
بۆ، سەرا پەردەی دڵ کەر وەمەنزڵ(۱)
تا لادێ جەگل زامان فارغ بوون
هیچ باکم نیەن جەودما بمروون(۲)
گۆش دەرە وەفەرد فخر العلما
چەند ظەریف نەڕووی مەجازی فەرما(۳)
(بێ زامی خەدەنگ مۆژەی مەهڕووان
نەنگەن وەسارای قیامەت لوان)(٤)

* * *

= واتە: قرچەقرچ و چۆقەی سووتانی جگەرم بەردی لەسەر زەوی تواندەوە، کەچی هێشتا پزیسکەیەکی بە تۆ نەگەیشتووە.
(دەکرێ دێڕی دوایی بە شێوەی ڕستەیەکی پرسیاری بخوێنرێتەوە، کەواش جوانترە، چونکە پەیوەندییەک لەگەڵ وشەی (ئەلعەجەب)دا دروست دەکات.
(۱) وێنای: وەکو، شێوە. خەد: کولم.
واتە: ئەی یاری باڵا وەکو سەرووی، چاو وەکو نێرگسی، کولم وەکو گوڵ، وەرە بارەگای دڵم بکە بە شوێن و مەنزڵی خۆت تێیدا سەقامگیر ببە.
(۲) لادێ: تاوێ. فارغ بوون: ئاسوودە بم. جەودما: لەوەودوا.
واتە: تاکو تاوێ لە ئێش و گلی زامەکانم ئاسوودە بم و دوای ئەوە ئیتر هیچ ترسێکم نییە کە بمرم.
(۳) فخر العلما: زانایەکی بەرجەستەی خەڵکی شاری سنە بووە و نازناوی شاعیرانەی (حەیران) و ناوی خۆیشی مەلا محەممەد صالحی کوڕی مەلا عەبدولمؤمین بووە. ظەریف: جوان، ناسک. مەجازی: دڵداریانە. فەرما: فەرمووی.
واتە: گوێ بدە بەم بەیتە شیعرەی فخر العلما، کە لە ڕووی دڵدارییەوە چەند جوان فەرمووی.
(٤) خەدەنگ: تیر. مەهڕووان: ئەوانەی سیمایان وەک مانگ وایە. لوان: ڕۆشتن.
واتە: بەبێ زامی تیری برژانگی ئەو کچانەی سیمایان وەک مانگ وایە، ڕۆشتن بۆ مەیدانی حەشر نەنگ و عارە.

*بریان بەندی دڵ وەتیری قەزا
صەدای ئەڵوەدای مزگی هۆش خێزا[١]
سەر قافڵە کۆچ کەرد پەی مەفتەنی ویش
هیچ نەبی وەخەم مەنسووبان و خویش[٢]
نووری نیگاهت خامۆش بی، دەرحاڵ
زمناکۆی دەروون بی وەکۆی زووخاڵ[٣]
دڵ بێ قەرارەن شەوق بێ زەوق کەردەن
جەردەی مەرگ دورجش وەتالان بەردەن[٤]
پایتەختی ذیکر و کاخی تەهلیلە
بێ پاشا مەندەن، وای چ موشکیلە[٥]

* ئەم شیعرە بۆ لاواندنەوەی شێخ سیراجەددینی تەوێڵە نووسراوە کە لەتەمەنی ٨٨ساڵیدا ساڵی ١٨٦٨ کۆچی دوایی کردووە.

(١) بریان: برا. ئەڵوەدا: بە کوردی کراوی (الوداع)ی عەرەبییە، بە واتای خودا حافیز، لە شیعرەکەدا مەبەست لە (الوداع... الوداع)ی تەراویحە لە شەوی پانزەی ڕەمەزان بەدواوە. مزگی: مزگەوت. خێزا: هەڵسا.

واتە: بەندی دڵ بە تیری قەزا بڕا و دەنگی (الوداع) لە مزگەوتی هۆش و ئاگاییەوە هەڵسا.

(٢) مەفتەن: لەوە دەچێ لە (موطن)ی عەرەبییەوە وەرگیرابێ بە واتای شوێن و نیشتمان. وێش: خۆی.

واتە: سەر قافڵەچی کۆچی کرد بۆ زێد و نیشتمانی خۆی و هیچ نەبوو بە خەمی مەنسووب و خزم و خۆێشەکانیەوە.

(٣) دەرحاڵ: دەستبەجێ. زمناکۆ: چیایەکی سەرکەشە دەڕوانێ بەسەر شاری دەربەندیخاندا.

واتە: دەستبەجێ نووری نیگات خامۆش بوو، بەوەش چیای زمناکۆی دەروون بوو بەقەرەبرووت.

(٤) کەردەن: کردووە. دورج: سندووق، ئەو سندووقەی کە خشڵ و جەواهیراتی تێدا هەڵدەگیرێ.

واتە: دڵ بێ ئارامە و شادی و شەوقی بێ زەوق کردووە، چونکە جەردەی مەرگ سندووقەکەی بە تالان بردووە.

(٥) کاخ: کۆشک. تەهلیلە: لا الە الا اللە وتن. مەندەن: ماوە.

واتە: پایتەختی یادی خواکردن و کۆشکی لا اللە الا اللە وتن بێ پاشا ماوەتەوە، وای چ گرفتێکە.



دیدەی خانەقا سۆماش داج بیەن
دەیجوورەن، یەڵدان، بێ سراج بیەن[٦]
صۆفی وەتەسبیح، دەروێش زرمەی دەف
ئادخەم مەشمارۆ، ئیدماچۆ ئەسەف[٧]
سراج سەرمایەی عەیش و سروور بی
رەهنومای قابیل ڕای سەخت و دوور بی[٨]
شەمعی جەرگەی شەو زیندەداران بی
صەهبای بێگەردی مەی گوساران بی[٩]
مورشیدی لایق، مەقام کامڵ بی
جەلادەهەندەی ئاینەی دڵ بی[١٠]

(٦) داج: تاریکی، تاریک داهاتن. دەیجوور: تاریکترین شەوی ساڵ. یەڵدا: درێژترین شەوی ساڵ. سراج: چرا، مەبەست شێخی سیراجەددینە. بیەن: بووە.

واتە: چاوی خەنەقا سۆمای تاریک داهاتووە و بۆتە دەیجوور و یەڵدا و بێ چرا یا بێ شێخ سیراجەددین ماوەتەوە.

(٧) ئاد: ئەو. مەشمارۆ: ئەژمێرێ. ئید: ئەم. ماچۆ: دەڵێ.

واتە: سۆفی بە تەزبیحەوە خەم و خەفەت دەژمێرێ و دەروێشیش بە زرمەی دەف دەڵێ ئاخ... بەداخەوە.

(٨) قابیل: شایان. ڕا: ڕێگا.

واتە: شێخی سیراجەددین سەرمایەی ژیان و شادی بوو، ڕێگا نیشاندەرێکی شایان و لێوەشاوە بوو بۆ ڕێگای سەخت و دوور.

(٩) شەو زیندەداران: کەسێک کە بە دەم تاعەت کردنەوە شەو تا بەیانی نەخەوێت. صەهبا: شەراب. مەی گوساران: شەراب خۆران.

واتە: مۆمی کۆڕی شەو زیندەداران بوو، شەرابی بێگەردی شەراب خۆران بوو (شەراب مەبەست شەرابی مەعنەوییە).

(١٠) مورشید: ڕێ نیشاندەر. لایق: شایان. کامڵ: تەواو، پلەیەکی بەرزی عاریفانەیە. جەلادەهەندە: ڕۆشنکەرەوە.

واتە: ڕێ نیشاندەرێکی شایان و پلەوپایەی کامیل بوو، ئاوێنەی دڵی لە ژەنگ پاک و ڕۆشن دەکردەوە.

ئیسته مەر دماش بەها بۆ سەرمەشق
هەرزان بکەرۆ بەهای مەتای عەشق(١١)

* * *

*بینایی دیدەم ئەربشنەوان گوڵ
گەنج ئاسا تەشریف بەردەنی وە گڵ(١)
پای وێ مکێشۆ جەدامانشان
نمەبۆ هەوەس بەرامانشان(٢)

* * *

تەسکین بەخشی دەرد مەجذووب-ەکەی وێت
هیچ مەبەر دڵگیر مەعلووم بۆ پەرێت(١)
من هەر ئەو (وامق)، ڕووت دام، دان خاڵت
سەر ئەفگەندەی دەر (عەذرا)ی جەماڵت(٢)

(١١) مەر: مەگەر. دماش: لە دوای. بەها: ئاماژەیە بۆ شێخ محەممەد بەهائەددینی کوڕە گەورەی شێخ سیراجەددین. بکەرۆ: بکات. مەتا: کەلوپەل (لە مەتاع ی عەرەبییەوە وەرگیراوە).
واتە: ئیستە مەگەر لە دوای مەرگی ئەو شێخ محەممەد بەهائەددینی کوڕی ببێتە شێخ و سەرمەشق و نرخی کەلوپەلی عەشق هەرزان بکات.

* * *

* ئەم چوارینەش مامۆستا مەلا عەبدولکەریم بڵاوی کردۆتەوە. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٤٩١.
(١) بشنەوان: ببیستێ. بەردەنی: بردووە.
واتە: بینایی چاوم ئەگەر گوڵ ببیسێ کە تۆ وەک گەنجینەیەک تەشریفت بردۆتە ژێر گڵەوە.
(٢) وێ: خۆی. مکێشۆ: هەڵدەکێشێ. بەرامان: سەر دەرهێنان.
واتە: (ئەوا گوڵەکە) بنجی خۆی لەبن هەڵدەکێشێ و ئارەزووی سەر دەرهێنان ناکات.

* * *

(١) تەسکین: ئارام. مەبەر دڵگیر: دڵگران مەبە. مەعلووم: ئاشکرا. پەرێت: بۆت.
واتە: ئەی ئارام بەخشی دەرد و ئازاری (مەجذووب) یا کەمەنکێش کراوەکەی خۆت، هیچ دڵگران مەبە و ئەوەت بۆ ئاشکرا بێت.
(٢) وامق: دڵداری عەذرا بووە و چیرۆکی خۆشەویستیەکەیان لەلایەن (عنصری) شاعیری ئێرانیەوە بە شیعر هۆنراوەتەوە. دام: داو. سەر ئەفگەندە: سەرشۆڕ. جەماڵ: جوانی.
واتە: من هەر ئەو وامقە عاشقەم کە ڕووخسارت داو و خاڵت دانەیەتی، لەبەر دەرگانەی عەذرای جوانیتدا سەرم دانەواندووە.



من هەر ئەو نێرگس وەهاری حوسنت
قڕ کەردەی سوپای زمسانی حوزنت(٣)
دیباچەی کیتاب عیشقی حەقیقیت
تەفسیری حەدیث دەئبی ڕەفیقیت(٤)
ئیسەیچە ئەرچی مەیلت بیەن سەرد
دڵت دان وەقەول ڕەقیبی نامەرد(٥)
ئەمما من جەسەر شەرتەکەی جاران
هەر غولامی تۆم شای وەفاداران(٦)

* * *

جەلای لەیلەوە... جەلای لەیلەوە
ناما ئەحوالێ جەلای لەیلەوە(١)
وەختەن جەهیجران ئەو بێ مەیلەوە
چون مەجنوون وێڵ بوون وە دووجەیلەوە(٢)

(٣) حوسن: جوانی. حوزن: خەم و خەفەت.
واتە: من هەر ئەو نێرگسەی بەهاری جوانیتم و هەر ئەوەم کە قڕم خستە ناو سوپای زستانی خەم و خەفەتت.
(٤) دیباچە: پێشەکی. حەدیث: گوفتار. دەئب: عادەت و خدە.
واتە: من هەر پێشەکیە نووسراوەکەی کتێبی ئەڤینی ڕاستەقینەی تۆم و هەر ئەوەم کە گوفتارەکانی خوو و خدەی هاوڕێیەتیتم ڕاڤە دەکرد.
(٥) ئیسەیچە: ئێستەش. بیەن: بووە. قەول: قسە.
واتە: ئێستەش ئەگەرچی مەیل و ئارەزووت سارد بۆتەوە و دڵت داوە بە قسەی ناحەزی نامەرد.
(٦) ئەمما: بەڵام.
واتە: بەڵام من لەسەر پەیمان و بەڵێنەکەی جاران هەر ماوم و هەر غولامی تۆم ئەی پاشا و گەورەی ئەوانەی کە وەفایان هەیە.

* * *

(١) ناما: نەهات
واتە: لەلای لەیلەوە هیچ هەواڵێ نەهات.
(٢) هیجران: دووری و دابڕان. دووجەیل: شوێنی مەجنوون.
واتە: خەریکە لەتاو دووری و دابڕانی ئەو بێ مەیلە وەک مەجنوون وێڵ و ئاوارەی دووجەیل بم.

نەپای دەلیلەن، نەرای ڕاگوزەر
نە ئاما ئەحواڵ، نەپەرسای خەبەر[3]
بی پەشێویی حاڵ، بی پەژارەوە
بی زامی کاریی گەستەی مارەوە[4]
چون شاهی شەترەنج گیرۆدەی سمکۆڵ
دەستاخم نەتۆی زنجیر، خانەکۆڵ[5]
ئامان بای شەماڵ بە تۆمەن ئومید
بۆ بە حاجەتی حسەینی شەهید[6]
شۆ وە ئاستانەی ساحێب وەفا و عەهد
بەصیدق و ئیخلاص بەجەخت و بەجەهد[7]
چونکە چەند ساڵەن من جەفام کێشان
دەروونم بە تیر تانەی بەد ئێشان[8]

(٣) ڕاگوزەر: شوێنی پەڕینەوە. ئاما: هات. پەرسای: پرسیت.
واتە: نە ڕێ نیشاندەر ڕێگەی هەیە و نە شوێنی پەڕینەوەش هەیە، تۆش نە هەواڵت هات و نە خەبەرێکت پرسی.
(٤) بی: بە ئەم، بەم.
واتە: منیش بەم حاڵە پەشێوەوە و بەم پەژارەوە، بەم زامە کاریگەرەی ماران گەستەوە.
(٥) سمکۆڵ: سمەکرەی ئەسپ لە جێگەی خۆیدا. دەستاخم: بەندم. خانەکۆڵ: ماڵوێران.
واتە: وەکو شای شەترەنج دەورم گیراوە و لە جێگەی خۆمدا گیرم خواردووە. بەند و دیلی زنجیرم و ماڵم وێرانە.
(٦) حاجەت: نیاز. خاتر.
واتە: دەخیلم بای شەماڵ ئومێدم بەتۆیە و وەرە بۆ خاتری حەزرەتی حسەین.
(٧) شۆ: بڕۆ. عەهد: پەیمان. صیدق و ئیخلاص: ڕاستی و دڵسۆزی. جەخت: پەلە، خێرا. جەهد: تێکۆشان، هەوڵدان.
واتە: بڕۆ بۆ دەرباری ئەو خاوەن وەفا و پەیمانە، بە ڕاستی و بە دڵسۆزی و بە پەلە هەوڵێکمان بۆ بدە.
(٨) کێشان: کێشاوە. ئێشان: ئێشاوە.
واتە: چونکە چەندین ساڵە من جەفام کێشاوە و دەروونم بە تیری تانە و لۆمەی خراپ ئێشاوە.



ئەو شەخسە جەفای بێ سامان بەردەن
نەڕای من چەندێ زوخاوان وەردەن[9]
تانەی ناکەسان،، ڕەقیبی بەدگۆ
وێنەی ماران گاز نەدڵ مەدۆسۆ[10]
ئومێدم ئیدەن فەردی فەریاد ڕەس
ڕەنجم بەرمەشۆ بە پووچ و عەبەس[11]
بێ سوود بەرنەشۆ عەزابی ڕەنجم
بە ناکەس نەدەی خەزانەی گەنجم[12]
جەبەعەد ئی گشت عەزاب و تاڵی
بەهەم بیاوین هەردوو حەلاڵی[13]
بنیشین وەهەم وەبێ دەردی سەر
بەکۆریی ڕەقیب عاقیبەت وەشەڕ[14]

(٩) بێ سامان: لەڕادە بەدەر. وەردەن: خواردووە.
واتە: ئەو کەسە جەفای زۆری کێشاوە و لەڕێی مندا یا لە پێناوی مندا چەندین زووخاوی خواردووە.
(١٠) بەدگۆ: خراپ بێژ. مەدۆسۆ: سوێ ئەدات (سوێی دەبێتەوە).
واتە: تانە و لۆمەی ناکەسان و ناحەزی خراپە بێژ، وەکو ماران گەستە ئازاری دڵ دەدات.
(١١) ئیدەن: ئەمەیە. فەریاد ڕەس: بە هاناوە هاتوو (مەبەست خوایە). بەرنەشۆ: دەرنەچێ.
واتە: هیوام ئەمەیە خوایە گیان ڕەنجم بە خەسار نەچێ و نائومێد نەبم
(١٢) واتە: بێ سوود وەرگرتن ئازاری هەوڵ و تێکۆشانم لە دەست دەرنەچێ، خەزانەی گەنجینەکەم (دڵخوازەکەم) نەدەی بە ناکەس بەچە.
(١٣) جەبەعد: پاشان، لەپاش. بە هەم بیاوین: بگەین بەیەک.
واتە: لە دوای ئەم هەموو سزا و تاڵی چەشتنە هەر دووکمان بە حەلاڵی بگەین بەیەک.
(١٤) بنیشین: دانیشین. عاقیبەت: ئەنجام.
واتە: بەبێ دەردی سەری پێکەوە دانیشین. بە کوێرایی چاوی ناحەزی عاقیبەت شەڕ.

تا قەڕنێ ئەیام بوویارین وە شاد
ئێمە خاتر خۆش، ڕەقیب ناموراد[١٥]

***

* جەلای لەیلەوە...

نەمان ئەحوالێ جەلای لەیلەوە
وەختەن نەهیجران ئەو بێ مەیلەوە
چون (مەجنوون) بشوون وە (دوجەیل) ەوە
نەپای دەلیلەن، نەڕای ڕاگوزەر
نە ئەحوالْ خێر، نە ئامان خەبەر
چون شای (شاترەنج) گیرۆدە و مەلوول
دووساخم نەتۆی زنجیر (خانەی كوول)
شۆوە ئاستانەی شای شاپەسەندان
شۆخ شیرین كار سەردار ڕەندان
واچە بەو نیشان ڕۆشو جە پێوار
نیشتە بیم بە هەم بێ خەوف جە ئەغیار
ئەو بە ڕێزەی ڕاز، من بە ئاه سەرد

(١٥) قەڕن: ماوەیەک (لێرەدا واتای سەدە ناگەیەنێ). بوویارین: ڕابوێرین. خاتر: دڵ.
واتە: تا ماوەیەک ڕۆژانێ بە شادی ڕابوێرین، ئێمە دڵشاد و ناحەز ناموراد.

***

* ئەم پارچە شیعرە کاک محەممەد عەلی قەرەداغی لە کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردیدا بڵاوی کردۆتەوە، بەڵام لەگەڵ نوسخەکەی بەردەستی ئێمەدا جیاوازیان هەیە، بە پێویستی دەزانم لێرەدا بۆ بەراوردی ئەدەبی ئەوی لای کاک محەممەد عەلیش بڵاو بکەمەوە. ئەڵبەتە ئەبێ ئەوەش بڵێین کە لە ناو بەیاز و دەستنووسە کۆنەکاندا گەلێ شیعرمان هەیە کە هەر نووسەرەی بە شێوەیەک نووسیویەتیەوە و جیاوازی وشە و تەرکیبات و بەیت و نیوە بەیت لە نێوان نوسخەیەک و نوسخەیەکی تردا دەبینرێ.



سەرگوزەشتەمان حیكایەت مكەرد
واتم: بە تۆمار عومر فانی مەن
قەباڵەی حەیات زیندەگانیمەن
جەودەمدا چەند تا جە زوڵف تاتاش
بەستەبەست وێنەی (بەڕەزا)ی ڕووی تاش
من سەندم جەدەست ئەو بەرگوزیدەم
سێ جار پەیاپەی مالّام وەدیدەم
پێم بەخشا دەستەی زوڵفان عەنبەرین
جەتەنخوای، ئینعام و یەردەی وەرین

***

خەزانی خەمت داش نە باخچەی دڵ
شكۆفە تاسا، پەژموورده بی گوڵ[١]
سەرای سینەمات، دنیام خەمۆشەن
سەدای جەرگ مەیۆ شین و ڕۆ ڕۆشەن[٢]
دیارەن جەزەڵ سەهمم مەینەت بی
وەرنە تۆكەی یەند بێ مەرحەمەت بی[٣]

(١) داش: دای.
واتە: خەزانی خەمت هێرشی هێناو دای لە باخچەی دڵ، چرۆ تاسا و گوڵیش ژاکا.
(٢) مەیۆ:دێت.
واتە: (دوای ئەو هێرشە) ماڵە گەورەی سنگ كزومات بووە و دنیام كپ بووە، تەنیا دەنگێک لە جەرگەوە دێت ئەویش شین و ڕۆڕۆیە.
(٣) جەزەڵ: كورتكراوەی (جەئەزەل) بە واتای هەر لە سەرەتاوە یا هەر لە بوونمەوە. سەهم: بەش.
وەرنە: ئەگینا.
واتە: دیارە هەر لەسەرەتای بوونمەوە بەش و پشكم مەینەت بووە، ئەگینا تۆكەی ئەوەندە بێ ڕەحم و سۆز بوویت.

(ئازیز وەس بووزەم نەگێجاوی خەم)
نەومیدم مەکەر چون دێوانەی شەم(٤)
ساوەسەن شانای مەودای زەهرالوو
ڕەشکەی ڕۆح جەکای ئێش بیەن مەملوو(٥)
دەرگای لوطفەکەت وازکەر دەخیلم
(بنەک داری خەم خەیلێ زەلیلم)(٦)
یە (مەجذووب) واتەن بینایی چەمان
سا نەجاتش دەر جەدای بێ دەرمان(٧)

***

(٤) بووزەم: بم خەرە. نەومید: کورتکراوەی (نائومێد).
واتە: ئازیزەکەم بەس بم خەرە ناو گێژاوی خەمەوە و وەکو وەلی دڵداری شەم هیوا بڕاوم مەکە. (میسرەعی یەکەمی ئەم بەیتە هی مەولەوییە و تێهەڵکێش کراوە).
(٥) شانای: وەشاندنی. زەهرالوو: ژەهراوی. مەملوو: پڕ.
واتە: دەسا وەشاندنی تیری نووک تیژی ژەهراوی بەسە، من ڕەشکەی ڕۆحم پڕ بووە لە کای ئێش و ئازار.
(٦) وازکەر: بکەرەوە. بنەکدار: بازرگانێ کاڵا بە شێوەی دەستە و دەرزەن بفرۆشێ. خەیلێ: زۆر.
واتە: دەخیلتم دەرگای سۆز و لوتفت بکەرەوە، چونکە من خەم بە دەستە و دەرزەن دەفرۆشم و زۆر داماوم. (میسرەعی دووەم هەر هی مەولەوییە و تێهەڵکێش کراوە).
(٧) یە: ئەمە. واتەن: وتوویەتی. جە دای: لە دەردی.
واتە: ئەم شیعرانە مەجذووب وتوویەتی ئەی بینایی چاوەکانم، سا تۆیش لە دەردی بێ دەرمان ڕزگاری کە و بیپارێزە.



خالۆ ظاهیر بۆ وەزەینی عارف
خالی بۆ وەشان شێوەی تەعارف(١)
مشیامن وەی دەرد بێ سامانەوە
وەی صەفای ئامای سەد ئامانەوە(٢)
هەی هو دەمێ بی تەشریف بوەردام
دەس وەی زیندەگیی عەبەث نەکەردام(٣)
بەڵام مالوومەن شک نەداروو لێش
مەرهوونەن ئومور پەرێ وەختی وێش(٤)

***

(١) ظاهیر بۆ: دەرکەوێ، ئاشکرا بێ. عارف: زانا، خواناس، لە زمانی فارسیدا واتای (ئارامگر)یشی وەرگرتووە. بۆ: بێ. وەشان: لە (شأن)ی عەرەبییەوە وەرگیراوە بە واتای شەوکەت و پلەوپایە. تەعارف: لە فارسیدا جگە لە یەکتر ناسین بەواتای ئاشنایی نواندنیش دێت.
واتە: خالۆ... با لە زەینی پیاوی خواناسدا یا زانادا ئەوە دەرکەوێ کە نامەوێ پلەی ئاشنایەتی خۆم دیاری بکەم (مەبەست ئەوەیە کە پێویست ناکات باسی دۆستایەتی نێوانمانت بۆ بهۆنمەوە).
(٢) مشیا: دەبوو. سامان: لێرەدا بە واتای ئارام دێت. ئامای: هاتی.
واتە: دەبوایە من بەم ئازارە بێ ئارام و ئۆقرەوە و بەم سەفایەی کە هاتی و سەد ئەمان و دەخیلی پێوەیە.
(٣) بوەردام: ببردایە. زیندەگی: ژیان. عەبەث: پڕوپووچ.
واتە: هەیهوو دەبوایە دەمێک بوو بڕۆشتمایە (واتە بمردمایە) و دەستم بەم ژیانە پڕوپووچە نەکردایە.
(٤) ماوومەن: دیارە (لە معلوم)ی عەرەبییەوە وەرگیراوە. نەداروو لێش: لێی نییە. مەرهونەن: لەگرەودایە، ڕەهن کراوە. پەرێ: بۆ. وێش: خۆی.
واتە: بەڵام دیارە و گومانم لێی نییە کار و فەرمان بۆ وەختی خۆی خراوەتە گرەوو دانراوە.

* خالۆ! وە دیدەی ئازیزی خالۆت
وە نالەی وەیاد دووریی تۆ نالۆت
جەوساوە خالۆت ئازیزش مەردەن
ڕۆم جەشەوی تار تەوفیر نەکەردەن
ظولمات بی وەلام سەر هەردی ئێلاخ
هەماها گەرمەسێر بین وە (ئاخ داخ)
(قەسر) و (بێشکان) صەفای (سەربیرە)
سەیری سەیرانگەی سەر سەراو (دیرە)
مەزەی قەتارەی قازان نەقەتار
گومەتەی جەیران نەباغچەی (حەسار)
سەیری هاژەی تاف سافی (قۆرەتوو)
نیگای نازنەعەین ئاهووی سەر بەسوو
تەماشای بینای (حەوش) خۆش بونیاد
تەجرەبەی تەصویر تاقەکەی فەرهاد
لەذیذیی شنۆی شکارگەی (سەرنەفت)
لێم بیەن وەژار مەندەی تاس هەفت

دەربارەی ئەم میرزا محەممەدە منیش لە ڕێگەی خۆمەوە لە هەندێ لە پیرەمێردانی نەورۆڵی پرسیارم کرد، لە ئەنجامدا لای بەڕێز (کوێخا محەممەدی سەراو) کە دەبێتە مێردی پووریی دایکم بە دڵنیاییەوە وتی: کە ئەو میرزا

* ئەم شیعرە مامۆستا مەلا عەبدولکەریم لە هەمان سەرچاوەی پێشوودا ل ٤٩٥ بڵاوی کردۆتەوە. لە پەراوێزی شیعرەکەشدا زانیارییەکی تازەی داوینەتێ کە فەرموویە: ئەحمەد پریسی برادەرێکی ئەدەب دۆستی بووە ناوی میرزا محەممەد بووە، لەگەڵ میرزا مەحموودی برای لە دێی (میراولی) دانیشتوون لە نزیک هەڵەبجە. برایەکی تریشی بووە میرزا عەبدوڵڵا ناو مەنسووبی وەسمان پاشای جاف بووە. ئەمانە لەو چەرخەدا دیار بوون و دەوریان بووە.
میرزا محەممەد کوڕێکی ئەمرێ، ئەحمەد پریسیش نامەی پرسە و سەرەخۆشی لێکردنی بۆ ئەنووسێ، ئەویش بەم پارچە شیعرە وەڵامی ئەداتەوە.



محەممەدە باوە گەورەی ئێوەیە لە سەری دایکەوە. واتە دایکم فاطمە کچی ڕابیعە کچی فەتاحی کوڕی میرزا محەممەد.

لە پارچە شیعرەکەی میرزا محەممەددا ئەو ناوانەی خراونەتە ناو دوو کەوانەوە ناوی شوێنە خۆشەکانی ناوچەی گەرمیانن، پێ دەچێ ئەو کاتە کە کوڕەکەی مردووە لە گەرمیان بووبێ.

هەروەها لە شیعرەکەدا ئەحمەد پریسی بە (خالۆ) ناوی بردووە، ئەویش لە یەکەم بەیتدا دەڵێ (خالۆ وە دیدەی ئازیزی خالۆت) کە ئەمە ئەوە دەردەخات خالۆی ئەحمەد پریسی بووبێ. نموونەی شیعرێکی تری ئەم شاعیرەم لەلایە، بۆ ئەوەی لە بەڵای ڕۆژگار ڕزگاری ببێت لە داوێنی ئەم کتێبەدا بڵاوی دەکەمەوە.

***

دەروونم زامەن... دەروونم زامەن
یاران، یاوەران، دەروونم زامەن[١]
قرچەی شکەستەی پێشەی ئەعزامەن
چەنی دەردی دڵ شین و عەزامەن[٢]
دەک قاصید زمان لەتار لەتار بای
وەنێشی ماری حوڕەیش زامدار بای[٣]

(١)زامەن: زامدارە.
واتە: هاوڕێیان، برادەران، دەروونم زامدارە.
(٢) شکەستە: وردبوون، تێکشکان. پێسە: ئێسقان. ئەعزا (أعضاء): ئەندامی لەش. چەنی: لەگەڵ.
عەزا: پرسە و تەعزیە.
واتە: قرچەقرچی ورد بوون و تێکشکانی ئەندامەکانی لەشمە و لەگەڵ دەرد و ئازاری دڵمدا شیوەن و تەعزییەمە.
(٣) قاصید: پەیامبەر، تەتەر. لەتار لەتار: پارچە پارچە، لەت و کوت. حوڕەیش: جۆرە مارێکی کوشندەی ژەهراوییە.
واتە: دەک تەتەر زمانت لەت و کوت بێ و بەنووکی تیژی (ددانی) ماری حوڕەیش زامدار بی.

هەوارە و هەوار هەرداخ وەکۆڵ بای
چون مەجنوون دایم وا مەندەی چۆڵ بای[٤]
ئی خەبەر چێش بی دات نەپەردەی گۆش؟
وەتالان بەردت خەزانەکەی هۆش[٥]
ئیسە دڵ و هۆش، چەم و دەست و دەم
چەمەریشانەن، وا وەیلا و ماتەم[٦]
مەگرەوان بە کوڵ، مەواچان هەیرۆ
پەی مەرگی ناکام ئەوڕەحمان هەیرۆ[٧]
هەیرۆ سەرقەتار جەهێلانم رۆ
وەش ڕەفتارەکەی ناو خێلانم رۆ[٨]
سککەی با ڕەواج بازاڕی عەشق رۆ
نەو ڕاویارەکەی ڕاگەکەی حەق رۆ[٩]

(٤) چون: وەکو. وامەندە: بەجێماو.
واتە: هەوارە و هەوار هەر داخ و خەفەت بە کۆڵتەوە بێت، وەکو مەجنوون هەمیشە لە دەشت و چۆڵاییدا بەجێ مابیت.
(٥) چێش بی: چی بوو. گۆش: گوێ. بەردت: بردت.
واتە: ئەم هەواڵە چی بوو دات لە پەردەی گوێ؟ و خەزێنەی هۆشت بە تالان بردم.
(٦) چەم: چاو.
واتە: ئێستە بە جارێ دڵ، هۆش، چاو، دەست، دەم، چەمەری دەگێڕن و واوەیلا و ماتەمیانە.
(٧) مەگرەوان: دەگرین. مەواچان: دەڵێین.
واتە: بەکوڵ دەگرین و دەڵێین هەیرۆ، هەیرۆ بۆ مەرگی لە ناکاوی عەبدولڕەحمان.
(٨) وەش: خۆش.
واتە: هەیرۆ... سەرقەتاری لاوانم رۆ و خۆش ڕەفتارەکەی ناو خێلانم رۆ.
(٩) با ڕەواج: بە برەو. نەو ڕاویار: ڕێبواری تازە.
واتە: پارەی بەبرەوی بازاڕی عەشق رۆ، تازە ڕێبوارەکەی سەر ڕێگای خودا رۆ.



تازە مەی وەردەی مەیخانانم رۆ
یاگەوەش کەردە نە جینانم رۆ[١٠]
جەی دنیای فانی نەیاوان وەکام
جەولانە سایەی شای فخر الأنام[١١]
جە قەسر و باخێ جاگێرە بێ بیم
موبارەکت بۆ جنات النعیم[١٢]

***

دەک فەلەک جەرگت چون جەرگم ڕێش بۆ
زامانت ناسۆر دایم پڕ ئێش بۆ[١]
چۆن دڵت ئاما ئەو بەرگوزیدە
ئەو ئاهوی تاتار سۆسەن چەریدە[٢]
ئەو پەری شێوە، ئەو بەدر ڕوخسار
ببەری وەسای گڵکۆی تەنگوتار[٣]

(١٠) وەردەی: خواردووی. یاگە: شوێن. جینان: بەهەشت.
واتە: تازە مەی خواردووەکەی ناو مەیخانانم رۆ، جێگە خۆش کردووەکەی ناو بەهەشتم رۆ.
(١١) جەی: لەم. نەیاوان: نەگەیشت. فخر الأنام: واتە پێغەمبەر.
واتە: لەم دنیا هیچەدا بە ئامانج نە گەیشت، لەو دنیا لە سایەی پێغەمبەرەوە.
(١٢) جاگێرە: جێ بگرە. جنات النعیم: بەهەشت.
واتە: لەکۆشک و باخێکدا بێ ترس جێگەیەک بگرە و بەهەشتت پیرۆز بێ.

***

(١) ڕێش بۆ: بریندار بێ.
واتە: دەک فەلەک جەرگت وەکو جەرگم بریندار بێ، زامەکانت ناسۆر بن و هەمیشە پڕ لە ئێش بن.
(٢) ئاما: هات. بەرگوزیدە: هەڵبژاردە. تاتار: ناوچەیەکە لە چین کە ئاسکی زۆرە. چەریدە: لەوەڕیاو.
واتە: چۆن دڵت هات ئەو شۆخە هەڵبژاردەیە، ئەو ئاسکی تاتارەی کە گیای سۆسەن خۆراکی بوو.
(٣) بەدر: مانگی چواردە. ببەری: ببەی.
واتە: ئەو پەری شێوەیە، ئەو سیما وەک مانگی چواردەیە، ببەی بۆ ناو گۆڕی تەنگ و تاریک.

سەوڵی خەرامان هاوڕازت لوان
سابالآی سەهییت چەم کەرچون کەمان(٤)
نێرگس چەم مەڕێژ وە شنۆی وەهار
چەقت پەی چێشەن دمای کۆچی یار؟(٥)
وەڕەزا زوڵفت بقاچە بێ ناز
هەنی چەنی تای کێ مەکەری ڕاز؟(٦)
ئاخ چەند ڕۆێ بی چەنەم دوور بی خەم
ئارۆ گێلاوە وێش دانە قەرەم(٧)
چون هەردە جاران ئاماوە یاگەش
زانام ئەو نامەرد گوم کەردەن ڕاگەش(٨)
جاریۆتەر شادی جە دڵ بەرکەردەن
میوەجاتی شەوق وەیەک ژەم وەردەن(٩)

(٤) لوان: ڕۆشت. سەهی: قنج و قیت.
واتە: ئەی دار سەرووی بە لەنجەولار هاوڕازەکەت ڕۆشت، دەسا تۆش بالآی قنج و قیتت وەکو کەوان بچەمێنەوە.
(٥) شنۆ: شنە. پەی چێشەن: بۆچییە. دمای: دوای.
واتە: ئەی گوڵی نێرگس چاوت بە شنەبای بەهار مەڕێژە، لە دوای مەرگی ئەو یارە خۆشەویستە چاوت بۆچییە؟
(٦) وەڕەزا: بەڕەزا، گیایەکی بۆنخۆشی کوێستانیە. هەنی: ئیتر. چەنی: لەگەڵ. مەکەری: دەکەی.
واتە: ئەی بەڕەزا زوڵفت بە بێ ناز هەڵپاچە، ئیتر لەگەڵ تاڵی زوڵفی کێدا قسەی شیرین دەکەیت.
(٧) ڕۆێ بی: ڕۆژێ بوو. چەنەم: لێم. ئارۆ: ئەمڕۆ. گێلاوە: گەڕایەوە. وێش: خۆی.
واتە: ئاخ... چەند ڕۆژێ بوو خەم لێم دوور بوو، کەچی ئەمڕۆ گەڕایەوە و خۆیدا لە قەرەم.
(٨) هەردە جاران: جارانی پێشوو، ئەوسا. ئاما: هات. یاگە: شوێن. ڕاگەش: ڕێگەی.
واتە: دیسان وەکو ئەوساهاتەوە جێگەی خۆی و سەقامگیربوو، زانیم ئەو نامەردە ڕێگای خۆی گوم کردووە.
(٩) بەرکەردەن: دەرکرد. وەردەن: خواردی.
واتە: جارێکی تر لەدڵمدا شادی دەرکرد و هەرچی میوەی شەوق و خۆشیم هەبوو بە ژەمێک خواردی.



سەلامون عەلەیک تاقە هامڕازم
ئەی مەعشووقەکەی بە عیشوە و نازم(١٠)
نمازە شادی و کەیف و مەیل و شەوق
بەیان، نەوکاخە تێر بکەران زەوق(١١)
سەرای خاصی تۆن هەر پەی تۆ خاسەن
مەجذووب نەزومرەی خودا نەشناسەن(١٢)

***

دڵ غەرقی گێجا و مەینەت و غەم بی
بالآ چون چەوگان چەمیدە و چەم بی(١)
خێڵخانەی شادی جە کۆماری دڵ
کۆچ کەردەن فەنا کەردەن وە مەنزڵ(٢)

(١٠) مەعشووقە: دڵخواز.
واتە: (منیش بەخەمم وت) سلآوت لێ بێ تاقانە هاوڕازەکەم، ئەی دڵخوازەکەی بەخەمزە و نازم.
(١١) نمازە: مەهێڵە. بەیان: بێن. کاخ: کۆشک.
واتە: (ئەی خەم) مەهێڵە شادی و خۆشی و ئارەزوو بێنە ئەو کۆشکەوە (دڵمەوە) تێر زەوق بنوێنن.
(١٢) سەرا: ماڵی گەورە. خاص: تایبەت. پەی: بۆ. زومرە: کۆڕ.
واتە: (دڵم) سەرای تایبەتی تۆیە و هەر بۆ تۆ چاکە، مەجذووب لە کۆڕ و دەستەی خوانەناسانە.

***

(١) چەوگان: گۆچان، گالۆک. چەمیدە: چەماوە.
واتە: دڵ نوقمی گێژاوی مەینەت و خەم بوو، بالآم وەکو گۆچان چەمییەوە.
(٢) خێڵخانە: هۆز. کەردەن: کرد. فەنا: لەناوچوون.
واتە: هۆز و عەشیرەتی شادی و خۆشی لەکۆماری دڵدا کۆچی کرد و فەنای کرد بە هەوا و مەنزڵی خۆی.

